

# ئەو

# (الـــهـــو)

نوسەر :

شێخی ئەکبەر موحیەدین ئیبن عەرەبی

وەرگێڕان

هەژیر ئیسماعیل لالە ئەحمەد

ئەکادیمیای زانستی کوردی

ناوی کتێب : ئەو (الهو)

نوسەر : شێخی ئەکبەر موحیەدین ئیبن عەرەبی

وەرگێڕان : هەژیر ئیسماعیل لالە ئەحمەد

ناوەند : ئەکادیمیای زانستی کوردی

ساڵی بڵاوکردنەوە : ٢٠٢٤

ئەکادیمیای زانستی کوردی
Kurdish Science Academy

# پێشەکی

## بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

## اللهُمَّ صَلِّ على سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ الوَصفِ وَالوَحْيِ وَالرِّسَالَةِ وَالحِكْمَةِ وَعَلى آلِهِ وَصَحبِهِ وَسَلِّمْ تَسليماً

**ئەمە یەکێکە لە بەرهەمە ناوازەکانی شێخی ئەکبەر حەزرەتی موحیەدین ئیبن عەرەبی کە زانایەکی کەم وێنە و کەم شێوە بووە لە سەردەمی خۆی و هەموو سەردەمەکاندا ، لەم بەرهەمەدا شێخ ئیبن عەرەبی بە پوختی ئەوە دەخاتە ڕوو کە هەموو بونەوەران لەڕاستیدا بوونێکی وەهایان نییە کە دواتر بە لەناوچوون کۆتایی بێت و ئەو بوونەی هەیە تەنها بوونی خودایە ، واتا هەر خودا هەبووە و هەر ئەو دەمێنێتەوە لە کۆتاییدا ، بۆ ئەوەی خودا تاک و تەنها و بێ هاوەڵ بێت پێویست دەکات کە بونەوەران وجودێکی حەقیقیان نەبێت چونکە ئەگەر هەیانبێت ئەوا دەبنە هاوەڵ لەگەڵ وجودی خودادا ، هەربۆیە شێخ ئیبن عەرەبی لەم نامەیەدا کە بە ناونیشانی (هو) واتا (ئەو) دێت و مەبەست پێی خودایە ، ئاماژە بە تەوحیدێکی تەواو پوخت و ڕاست و دروست دەدات کە بونەوەران پێویستە ئەم تێگەیشتنە لە ناخ و دڵیان بچێنن و بەو شێوەیە لە دونیا و بوون و خودا تێبگەن ، هیوادارم لێی سودمەند بین**

**هەژیر**

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

**متمانەم بە ئەوە و پشتی پێ دەبەستم .**

**سوپاس بۆ خودا ، سەلامی خودا لەسەر ئەوانەی کە خودا هەڵی بژاردوون ، پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) فەرموویەتی : (هەرکەس خۆی بناسێت ئەوا خودا دەناسێت) ، سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە پێش تاک و تەنهایی ئەو هیچ شتێک نەبووە مەگەر ئەو نەبێت ، لەدوای تاک و تەنهاییەکەشی هەر ئەو هەبووە ، ئەو هەبوو و پێش و دواتری لەگەڵ نەبوو ، نە بەشی سەرەوەی هەبوو و نەش خوارەوە ، نە نزیکی هەبوو لێیەوە و نەش دووری ، نە چۆنیەتی هەبوو و نە شوێن ، نە ئانی بەسەر تێدەپەڕی و نەش سات ، نە سەردەم و نە کات ، نە گەردوونێک و نە شوێنێک ، ئەو تا ئێستاش بەو شێوەیە ماوەتەوە ، ئەو یەکێکە بەبێ ئەوەی یەکێکی هەبێت ، ئەو تاکە بەبێ ئەوەی تاکێکی هەبێت ، پێکنەهاتووە لە ناو و مانا ، بەڵکو ناوی ئەو ئەوە (هو) ، و ماناکەش هەر ئەوە ، نە ناوێک جگە لەو هەیە ، نە واتایەک جگە لەو ، هەر بۆیە ئەو ناوە و مانایە ، ئەو یەکەمە بەبێ سەرەتا ، دواینە بەبێ کۆتایی ، دیارە بەبێ ئەوەی دەربکەوێ ، پەنهانە بەبێ ئەوەی شاراوە بێت ، مەبەستم : ئەو هەیە لە پیتی سەرەتادا و هەیە لە پیتی کۆتاییدا ، ئەو بوونی هەیە لە پیتە شاراوەکان و ئەو بوونی هەیە لە پیتە پەنهانەکاندا ، بەبێ ئەوەی ئەم پیتانە تێکەڵ بە بوونی ببن ، بونی ئەم پیتانەش تەنها لەپێناو ئەوە ، بۆیە لەمە تێبگە بۆ ئەوەی نەکەویتە ناو هەڵەی حلولیەکان (ئەوانەی دەڵێن خودا دەچێتە ناو شتەکانەوە یان شتەکان دەچنە ناو خوداوە)**

**نە ئەو لە شتێکدایە و نە شتێکیش لەناو ئەودا هەیە ، نە لە دەرەوە و نە لە ناوەوە ، پێویستە بەم سیفەتە بیناسیتەوە ، نەک بە زانست و عەقڵ ، نەش بە تێگەیشتن و وەهم و خەیاڵ ، نەش بە هەست و چاوی سەر ، نەش بە چاوی دڵ و نەش بە درک پێکردن ، کەس نایبینێت غەیری ئەو و کەس درکی**

**پێناکات غەیری ئەو ، و کەس نایزانێت غەیری ئەو ، خۆی خۆی دەبینێت ، خۆی خۆی دەناسـێت ، کەسی تر نایبینێت و کەسی تر درکی پێ ناکات ، پەردەی وەحدانیەت و تاکو تەنهاییەکەیەتی کە نابینرێت و شـتێکی تر نییە جگە لەمە ، پەردەکەی بریتیە لە هەبوونی ، هەبوونی خۆی بە تـاک و تەنـهایی شـاردۆتەوە بەبێ چۆنیەتی ، کەس جگە لەخۆی نایبینێت و کەس جگە لە خۆی درکی پێ ناکات ، بە پێغەمبەرێک و نەش پیاوچاکێکی کامڵ و نەش فریشـتەیەکی نزیک لە خۆی ، پێغەمبەرەکە هی ئەوە و نێردراوەکە هی ئەوە ، پەیامەکە هی ئەوە و قسـەکە هی ئەوە ، خۆی ناردووە بە خودی خۆی بۆ خۆی بەبێ هیچ نێوەندگیرێک و هیچ هۆکارێکی تر نییە ، جیاوازی نیە لەنێوان پەیامهێن و پەیامهێنێکی تر ، ئەوەی خۆی هاتبێت یان پەیامی هێنابێت لە پەیامبەران ، هەبوونی پیتی الله هەبوونیەتی ، نە گۆڕیویەتی و نەش لەناوی بردووە ، نەش ناو و ماناکەی و هەبوونی گۆڕیوە بە شتێکی تر ، هەربۆیە پێغەمبەرمان (سـەڵەوات لەسـەر خۆی و بنەماڵەکەی) فەرموویەتی : (ئەوەی خۆی بناسـێت ئەوا خودا دەناسـێت) ، هەروەها دەفەرموێت : (خودای خۆمم بە خودای خۆم ناسـی) ، لێرەدا ئاماژە بەوە دەکات کە تۆ خۆت خۆت نیت ، بەڵکو تۆ ئەویت بەبێ تۆ ، نە ئەو هاتۆتە ناو تۆ ، نەش تۆ چویتەتە ناو ئەو ، نە ئەو لەتۆ دەرچووە و نەش تۆ لەو دەردەچیت ، مەبەستیشم لەمە بریتیە لەوەی کە : تۆ بونت هەیە و سیفەتەکەت بەم شێوەیەیە بەبێ گۆڕانهاتن بەسەریدا ، بەڵکو مەبەستم : تۆ نەبویت و هەرگیز نابیت ، نە بەخۆت و نە بە ئەو ، نە لە ئەو و نە لەگەڵ ئەو و لە لای ئەو و نە لەوەوە و نەش بۆ ئەو ، نە تۆ لەناو دەچیت و نەش بوونت هەیە ، تۆ ئەویت و ئەویش تۆیە ، بەبێ ئەو شـێوانەی باسـمان کرد ، ئەگەر بوونی خۆت بەم شێوەیە زانی ، ئەوا خودا دەناسیت ئەگەرنا نایناسیت ، زۆربەی خوداناسـان ناسینی خودایان داوەتە پاڵ فەنا و لەناوچوون لە هەبووندا ، یاخود فەنابوون لە فەنادا ، ئەمەش هەڵەیەکی ڕوونە ، چونکە ناسـینی خودا پێویسـتی بە فەنابوون لە بووندا نییە ، پێویسـتیشـی بە فەنابوون لە فەنادا نییە ، چونکە شتەکان بوونیان نییە ، هەرچیەکیش بوونی نەبوو لەناوچوونی بۆ نییە ، لەناوچوونیش دوای ئەوەیە کە**

**هەبوون بچەسـپێت ، ئەگەر تۆ خۆت ناسـی بەوەی بوونت نیە و لەناویش ناچیت ، ئەوا خودای گەورە دەناسیت ، ئەگەرنا نایناسیت.**

**بەوەشـی کە بڵێیت خودا دەزانێت کەوا هەبوون لەناودەچێت ، و فەنادەبێت لە فەنادا ئەوا تۆ هاوەڵت بۆ خودا داناوە ، چونکە ئەگەر سـیفەتی زانینی خودا بە لەناوچوونی هەبوون و فەنابوون لە فەنادا زیاد بکەیت ، ئەوا ئەوکات واتا هەبوون هەبووە بۆ جگە لە خودا و ئەمەش ناتەواوە و هاوەڵدانانێکی ڕوونە ، چونکە پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) فەرموویەتی : (هەرکەس خۆی بناسێت ئەوا خۆی دەناسـێت) ، نەیفەرموو ئەوەی خۆی لەناو ببات ئەوا خودای دەناسـێت ، جێگیرکردنی هەبوونی شـتانێک یەکناگرێتەوە لەگەڵ لەناوچوونی ، هەرشـتێکیش جێگیربوون و هەبوونی نەچەسـپێت ئەوا ناکرێت لەناویش بچێت ، تۆش هەبوونت هیچ نییە و هیچ نەبوونیش نادرێتە پاڵ شـتێکی لەناوچوو یاخود لەناونەچوو ، نەش پاڵ هەبوون و نەبوون ، پەیامهێن (سـەڵەوات لەسـەر خۆی و بنەماڵەکەی) ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە تۆ ئێسـتا بونت نییە ، وەک چۆن پێش دروسـتکردن بوونت نەبووە ، ئێستاش ، لەبەر فەرمایشتی پەیامهێن کە فەرموویەتی : (خودا بوونی هەبووە و هیچی لەگەڵ نەبووە) ، لە فەرمایشتەکە ئاماژەیە بۆ پێشتر و ئێستا و تا هەتا هەتایە ، ئێستا پێشترە ، خودا لە پێشتردا بوونی هەبووە و هەتا هەتایە بوونی دەبێت ، بوونی هەبووە پێشتریش بەبێ هەبوونی ئەزەل و ئەبەد و پێشتر ، ئەگەر وا نەبێت ، ئەوا تاک و تەنها نەدەبوو و پێویسـت بوو کە تەنها خۆی هەبێت بەبی هاوەڵ ، ئەگەریش هاوەڵی هەبوایە ئەوا ئەو هاوەڵە دەبوو خۆی بوونی بە زاتی خۆی هەبووایە نەک بە بوونی خودا ، بەمەش دەبووە خودایەکی تر ، ئەوەش مەحاڵە ، خودا هاوەڵ و شوێن و شێوە و کەسی نییە و هەرکەس شـتێکی لەگەڵ خودا یاخود لە خوداوە یاخود لەڕێگای خوداوە بینی ئەو شـتەش پێویسـتی بە خودا بوو ، ئەوا ئەو شـتەی کردۆتە هاوەڵێکی پێویسـت بە خودا لە خودایەتیدا ، هەرکەس ڕێگەی دا بەوەی کە شـتێک لەگەڵ خودادا هەبێت کە خۆی بە خودی خۆی یاخود ئەو خۆی ئەنجامی بدات بە**

**لەناوچوونی لە بووندا یاخود لە فەنابوونی لە فەنادا ، ئەوا ئەم تێڕوانینە زۆر دوور و ناپەســـەندە و هەرگیز بۆنی ناســـینی خودی نەکردووە ، چونکە هەرکەس بڵێت هەبوویەک هەیە کە خودا دروســـتی کردووە و بەوەوە جێگیرە ، ئەوا دەبێتە شـــتێکی لەناوچوو ، لەناوچوونیشـــی واتا فانیبوون لە فەنادا ، بەمەش فەنا دەچێتە ناو فەناوە ، ئەمەش هاوەڵدانان لە دوای هاوەڵدانانە ، ناســـینی خود نییە ، چونکە هاوەڵدانانە نەوەک خودا ناسین و نەش خود ناسین**

**ئەگەر کەسێک بڵێت : ئەی ڕێگای ناسینی خود و ناسینی خودا کامەیە ؟**

**لە وەڵامدا دەڵێم : ڕێگای ناسینیان ئەوەیە کە بزانیت کەوا خودای گەورە بوونی هەبووە و هیچی لەگەڵ نەبووە و ئێستاش بەو شێوەیەیە ، ئەگەر کەسێک وتی : خودی خۆم بە جگە لە خودا دەبینم و خوداش بە خودی خۆم نابینم !**

**لە وەڵامدا دەڵێم : پەیامهێن (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) بە خود مەبەستی بوو لە : هەبوونت و حەقیقەتەکەت ، نەک ئەو نەفس و خودەی کە بە لۆمەکار و فەرمانکەر بە خراپەیە ، بەڵکو ئاماژەی بۆ خود کردووە لە هەموو شتێک جگە لە خودای گەورە .**

**پەیامهێن (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : (خودایە شتەکانم بەو شێوەیە نیشان بدە کە هەن و دەبینرێن) ، لێرەدا ئاماژەی بۆ ئەو شـــتانە کردووە کە جگە لە خودان ، واتا ئەوەشـــم پێ بناسێنە کە جگە لە تۆیە ، بۆ ئەوەی بزانم و شـتەکان بناسـم ، ئەو شـتانە چین ؟ ئایا تۆن یان جگە لە تۆن ؟ ئایا کۆنە یاخود نوێیە ؟ ئایا ماوە یان لەناوچووە ؟ ئەگەر خودا ئەو شـــتانەی کە جگە لەخۆین نیشانی بدات بەبێ هەبوونی شتەکان جگە لە خۆی ، واتا ئەگەر شتەکانی وەک خۆیان بینی ، مەبەستم : واتا شتەکانی بە خودی خودا بینی بەبێ چۆنیەتی ، و بەبێ شوێن و ناو و ناوی ئەو شتانەی دێت بە دڵدا و شـــتەکانی تریش ، ئەوا هەبوونی خود و هەبوونی شـــتەکان لە شـــتدا وەک یەکن ، ئەوەی شـــتەکان**

**بناسێت خود دەناسێت ، هەرکاتیش خودی ناسی ئەوکات خودا دەناسێت ، چونکە ئەوەی پێی وایە جگە لە خودایە ، لە ڕاســـتیدا تەنها هەر خودایە ، بەڵکو زاتی خودا و خودا جیاوازن ، بەڵام تۆ نایزانیت کە دەیبینیت و نازانیت کە دەیبینیت ، هەرکات ئەم نهێنیەت بۆ درکا ، ئەوا دەزانیت کە تۆ جگە لە خودا نیت ، دەزانیت کە تۆ مەبەست و داواکراوەکەیت لە داواکردنی خوداکەتدا ، دەزانیت کەوا پێویستت بە فەنا و لەناوچوون و فەنا لە فەنابوو نییە ، بەڵکو نەبوویت و نابیت و کات و شـــوێنت بۆ نییە ، وەک پێشـــتر باســـمان کرد ، هەموو ســـیفەتەکانت بە ســـیفەتی خۆی دەبینیت ، ڕوکەشـــیشـــت بە ڕووکەشـــی ئەو و پەنهانیشـــت بە پەنهانی ئەو و ســـەرەتات بە ســـەرەتای و کۆتاییت بە کۆتایی ئەو ، بەبێ هیچ گومانێک لەکاتی ناسیندا ، ئەگەرنا پێش ئەوە سیفەتەکانت بە سیفەتی ئەو نابینیت ، خودی خۆشت بە ئەو دەبینیت بەبێ ئەوەی تۆ بچیتە ناوی یاخود ئەو بێتە ناوت نە بە زۆر و نە بە کەم ، خودا دەفەرموێت : (هەموو شـــتێک لەناو دەچیت تەنها خودی خودا نەبێت {القصـــص-٨٨}) ، بە ڕوکەش و پەنهان ، واتا ، هەبوو بونی نییە جگە لە ئەو ، جگە لەویش هیچ شتێک بوونی نییە ، تا پێویست بە لەناوچوون بکات و تەنها خودی خودا بمێنێتەوە.**

**مەبەستم : هیچ شتێک جگە لە خودی خودا بوونی نییە ، وەک چۆن کەسێک کە هیچ نەزانێت ، پاشان بیناســـێت ، ئەوکات بوونی لەناو دەچێت و نەزانیەکەشـــی لەناو دەچێت ، بەڵام لێرەدا بوونی لەناو نەبردووە بەڵکو نەزانیەکەی لەناوبردووە ، هەبوونی ماوەیە بە شـــێوەیەک کە ناگۆڕێت بوونی بە هەبوونێکی تر ، هەبوونی نەزانینیش نە هەبوونی کەســـێک کە بزانێتی بەجێ هێشـــتووە و نەش چوونە بەناو یەکدا ، بەڵکو نەزانیەکە بەرز بۆتەوە ، بۆیە پێت وانەبێ پێویستت بە فەنایە ، ئەگەر پێویستت بە فەنا و لەناوچوون بوو ، ئەوا ئەوکاتە تۆ پەردەی ئەوی ، پەردەش جگە لە خودایە ، پێویســـتە بە زاڵبوونی جگە لەو بەسەریدا کە لابچێت بۆ ئەوەی ببینرێت ، ئەمەش هەڵەیە ، پێشتر ئاماژەمان پێدا کە تاکو تەنهایی پەردەکەیەتی و شتێکی تر نییە ، هەر بۆیە شیاوە بۆ کەسێک کە گەیشتووە بەم حەقیقەت**

و ڕاســـتیە بڵێت : (من حەقم) ،و بڵێت : (گەورەیی و شـــکۆمەندی بۆ من) ، کەس پێی ناگات هەتا سـیفاتەکانی بە سـیفاتەکانی خودا نەبینێت ، خودی خۆشـی بە خودی خودا ، بەبێ تێکەڵبوون یان جودا بوونی ســـیفەت و خودەکان ، نەش چونە ناو خودا و نەش دەرچوون لێیەوە هەرگیز ، نەش بەوەی کە فانی بووە لە خودادا و نەش کە ماوەتەوە بە خوداوە ، وەها خۆی دەبینێت کە هەرگیز نەبوبێت و نەبێت ، پاشان لەناوچوو خودێک نەما جگە ئەو ، بوونێکیش نەما جگە لە ئەو ، ئەمەش ئاماژەیە بۆ پەیامهێن (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) کە دەفەرموێت : (جنێو بە کات و سەردەم مەدەن ، خودا کات و ســـەردەمە) ، وەک ئاماژەیەک بۆ ئەوەی کە هەبوونی کات و ســـەردەم هەبوونی خودای گەورەیە بەبێ هاوەڵ و کەسوکار و شوێن و شێوە ، پەیامهێن (سـەڵەوات لەسـەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : خودا فەرمووی : (ئەی بەندەکەم ! نەخۆش کەوتم نەهاتیت بۆ ســـەردانم ، داوام لێت کرد نەتدامێ) ، و بەم شـــێوەیە ، ئاماژەیە کە هەبوونی پرســـیارکار هەبوونی ئەوە و هەبوونی نەخۆش هەبوونی ئەوە ، هەرکات شـیا کە هەبوونی پرسـیارکار هەبوونی ئەو بێت و هەبوونی نەخۆش هەبوونی ئەو بێت ، ئەوا دەشـــێت هەبوونی تۆ هەبوونی ئەو بێت ، هەبوونی هەموو شـــتەکانیش لە پێکهاتەکاندا – لە شـــت و جەوهەرەکاندا- هەبوونی ئەو بێت ، کاتێک نهێنی گەردیلەیەک لە گەردیلەکان دەربکەوێت ئەوا نهێنی هەموو پێکهاتە شـــاراوە و ئاشـــکراکان دەردەکەوێت ، گەردیلەکانیش جگە لە خودا هیچ نابینن ، بەڵکو هەبوونی گەردیلەکان ناو و مانای خۆیەتی ، هەبوونی هەموویان هەر ئەوە بەبێ شـــک و گەمان ، و وەهـای نـابینیـت کە هەرگیز شـــتەکـانی بەدی هێنـابێـت ، بەڵکو دەبینیـت : (یەو هەموو ڕۆژێـک لە کاروبارێکدایە (الرحمن – ٢٩)) ، ئەمەش لە ئاشـــکراکردن و شـــاردنەوەی هەبوونی بەبێ چۆنیەتی ، چونکە (ئەو ســـەرەتا و کۆتاییە و ئاشـــکرا و پەنهانە و بەهەموو شـــتێک ئەو زانایە (الحدید-٣)) ، بە یەکبوونی خۆی دەرکەوت و بە تاک بوونی خۆی شـاراوە بوو ، ئەو بە خودی خۆی تاکە و دەسـەڵاتدارە و بە خودی خۆی کۆتایە بە هەمیشـــە بوونی ، هەبوونی پیتی یەکەم هەر ئەوە و هەبوونی پیتی کۆتایی

هەر ئەوە ، هەبوونی پیتە ئاشـــکراکان ئەوە و هەبوونی پیتە پەنهاکان ئەوە ، ئەو ناو و ماناکەیەتی ، وەک چۆن هەبوونی پێویستە ، پێویستە جگە لە خۆشی بوونی نەبێت ، ئەوەی پێی وابێت جگە لە ئەوە ئەوا ئەو جگە لەو نییە چونکە ئەو بەدووره لەوەی جگە لە خۆی بوونی هەبێت ، بەڵکو جگە لەو هەر خۆیەتی ، ئەو خۆیەتی بەبێ گۆڕانکاری لەگەڵ هەبوونی لە هەبوونێکی ڕوون و شـاراوەدا ، ئەوەشـی ئەم سیفەتەی هەبێ ئەوا سیفەتی زۆری کەیە کە سنور و کۆتایی نەبێت ، هەر وەک چۆن ئەوەی بمرێت ، هەموو سیفەتە خراپ و چاکەکانی لێی دادەبڕێن ، بەهەمان شێوەش ئەوەی بە شێوەیەکی مەعنەوی بمرێت ، هەموو ســـیفەتە چاک و خراپەکانی دەپچڕێن ، خودای گەورە دەســـەڵاتدار دەبێت لەهەموو حاڵەتێکدا ، لە پێگەی زاتی خودی خودادا دەبێت ، پێگەی ســیفەتەکانیشــی ســیفەتەکانی خودا دەبێت ، هەر بۆیە پەیامهێن (سـەڵەوات لەسـەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : (بمرن پێش ئەوەی بمرن) و دەفەرموێت : (بەندەکەم لێم نزیک دەبێتەوە بە ئەنجامدانی سـونەتەکان هەتا خۆشـم دەوێت ، کە خۆشـم ویسـت ، دەبمە گوێ و چاو و دەسـت و پێی) هەتا کۆتاییەکەی ، کە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە هەرکەسێک خۆی بناسێت ، ئەوا هەموو بوونی بە خودا دەبینێت ، گۆڕانکاری لە خودی خۆی و سیفاتەکانی نابینێت ، کەوا ئەو بەبونی خۆی هەبوو نەبووە بەڵکو نەزان بووە بە ناســـینی خۆی ، هەرکات خۆت ناســـی ، ئەوا لوتبەرزیت دەڕوات و دەبینیت کە جگە لە خودا هیچی تر نیت ، ئەگەر هەبوونێکی سـەربەخۆشـت هەبوو ئەوە پێویسـتت بە لەناوچوون و ناسـینی خود نییە ، دەبیتە خودایەک جگە لە خودا ، حاشـا کە غەیری خودا خودایەکی تر بوونی هەبێت .

لە سـودەکانی ناسـینی خود : فێربیت و دڵنیاببیتەوە کەوا هەبوونت بوون نییە و لەناوچوونیش نییە ، تۆ بونەوەر نیت ، نەبوویت و نابیت ، ئەوەش لە مانای (لا اله الا الله) دەردەکەوێت کە هیچ خودایەک نییە جگە لە خۆی ، هیچ بوونێکیش نییە جگە لە بوونی ئەو ، نەبوونێکیش جگە لە خۆی ، هیچ خودایەک

نییه جگە ئەو ، ئەگەر کەســـێ بڵێـت : تۆ بەمە خودایەتیەکەیـت پوچەڵ کردەوە ؛ دەڵێم چونکە نە خودایەکی دروستکەر بووە و نە دروستکراو ، نە بەدیهێنەر بووە و نە بەدیهێندراو ، ئەو ئێستاش هەر بەو شـــێوەیەیە ، بەدیهێنان و خوایەتیەکەی پێویســـتی بە بەدیهێنراو و دروســـتکراو نییە ، ئەو هەر بەدیهێنەر بووە ئەگەر هیچیشـــی نەهێنابێتە بوون ، دروســـتکەریش بووە ئەگەر هیچیشـــی دروســـت نەکردبێت ، هەموو زانـایی و دانـاییەکـان بۆ خودایە ئەوە دەکـات کە دەیەوێـت ، بڕیـاریش دەدات بە دەسەڵاتی خۆی ئەو پێش دروستکردنی بەدیهێنراوان بە هەموو سیفەتەکانی وەسف کراوە ، ئێستاش هەر بەو شێوەیەیە ، کات تێپەڕین کاریگەری لەسەر دروست ناکات لە ئێستا و داهاتوو و ڕابردوودا ، ڕووداني ئێستا و داهاتوو فەرمانە ڕووکەشەکەیەتی ، ڕوودانە پێشووەکانیشی فەرمانە پەنهانەکەیەتی ، پەناهانیشـی ڕووکەشـیەتی و ڕووکەشـیشـی پەنهانیەتی ، سـەرەتاکەی کۆتاییەکەیەتی و کۆتاییەکەی سـەرەتایەتی ، هەمووان یەکێکن ، و یەکێکیش هەموانە ، ئەو سیفەتی بریتی بوو لە (هەموو ڕۆژێک لە کاروبارێکدایە {الرحمن - ٢٩} ، هیچی لەگەڵدا نەبووە ، ئێســتاش بەو شـێوەیەیە ، هیچ بوونێکیش جگە خۆی بوونی نییە ، وەک چۆن لە ئەزەل و لەپێشیشدا وەهابوو (هەموو ڕۆژێک لە کاروبارێکدایە) ، نە ڕۆژی بەســەر تێدەپەڕێت و نە کاروبار ، وەک ئەوەی لەپێشـیش نە کاروبار و نە ڕۆژی بەســەردا تێپەڕیوە ، هەبوونی بوونەوەران و نەبوونیان هەمان شـتە ، ئەگەرنا دەبوونە بەشـێک لە تاکو تەنهایی خودا ، ئەمەش کەموکوڕیە ، خودا تاک و تەنها و بێ کەم و کوڕیە ، هەرکات خۆت بەم شـێوەیە ناسـی بەبی زیادکردنی کەسوکار و هاوبەش و هاوەڵ بۆ خودای گەورە ، ئەوە بە ڕاسـتی ناسیوتە ، هەر بۆیە پەیامهێن (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) زانی و بینی کە هیچ شتێک بوونی نییە جگە لە خودا ، پاشــان ئاماژەی کرد بۆ ئەوەی کە ناسـینی خود بریتیە لا ناسـینی خودای گەورە ، واتا خۆت بناســە ، واتا هەبوونت بناســـە کەوا تۆ نیت ، بەڵام تۆ نایزانیت ، واتا بزانە کە هەبوونت بوون نییە ، نەبوونیش نییە ، نە بوونـت هەیە و نەش لەنـاو دەچیت ، نەش بوونـت نیە و نەش لەنـاو نـاچیـت ، هەبوون و

نەبوونت هەبوونی ئەوە بەبێ هەبوون و لەناوچوون ، چونکە خودی هەبوون و نەبوونی تۆ هەبوونی ئەوە ، ئەوەش چونکە هەبوونی ئەو خودی هەبوون و لەناوچوونی تۆیە ، ئەگەر شـــتەکانت بینی بەبێ بینینی شتی تر لەگەڵ خودا و لەپێناو خودادا ئەوا بزانە کە ئەوە ، ئەوکات خۆت ناسیوە ، ناسینی خود بەم شـێوەیە ، بریتیە لە ناسـینی خودا بەبێ شـک و گومان ، نە شـتێک لە ئێسـتا و ڕابردوو هەیە کە لەپێناو ئەو و بۆ ئەو نەبێت ، ئەگەر کەسێک بپرسێت : ئایا ڕێگای گەیشتن بە خوا چییە ؟ تۆ دەڵێیت : جگە لە خۆی کەس نییە ، شتێک ئەگەر یەکێک بێت ئەوە ناگات بە خۆی

لە وەڵامـدا دەڵێم : گومـانی تێدا نییە کە لە ڕاســـتیـدا ئەوە نە گەیشـــتنە و نە لێکـدابڕانە ، نە دوورکەوتنەوەیە و نە نزیککەوتنەوە ، چونکە بەیەکگەیشـتن تەنها لەنێوان دووانـدا ڕوودەدات ، ئەگەر هاتوو یەکێک بوون ، ئەوا نە جیابوونەوە و نە پێگەیشـتن هەیە ، کەسـی گەیشـتوو پێویسـتی بە دوو شتی یەکسـان یاخود نایەکسـان هەیە ، ئەگەر یەکسـان بن ئەوا دوو شـتن ، ئەگەر یەکسـانیش نەبن ئەوا دەبنە دژ ، خودای گەورەش بەدوورە لەوەی هاوشـێوە و هاوەڵ و کەسـی هەبێت ، بۆیە گەیشـتنە بەبێ گەیشـــتن و نزیکیە بەبێ نزیکی و دووریە بەبێ دووری ، بەمەش دەگات بەبێ ئەوەی بگات ، نزیکە بەبێ ئەوەی نزیک بکەوێتەوە ، دوورە بەبێ ئەوەی دوور بکەوێت.

ئەگەر بوترێت : تێگەیشـــتین کە گەیشـــتن بەبێ گەیشـــتن واتا چی ، بەڵام ئایا نزیکبوونەوە بەبێ نزیکبوونەوە و دوورکەوتنەوە بەبێ دورکەوتنە واتا چی ؟ لە وەڵامدا دەڵێم : تۆ لە سەرەتای نزیکبوون و دوورکەوتنەوە هیچ نەبوویت جگە لە خودا ، بەڵام خۆت نەناســـیبوو ، نەتدەزانی کە تۆ ئەویت بەبێ خۆت ، هەرکات گەیشـــتیت بە خودا ، واتا کە خۆت ناســـی بەبێ هەبوونی پیتە زانراوەکانی عیرفان ، دەزانیت کەوا تۆ ئەو بوویت ، پێشـــتر نەتدەزانی کە تۆ ئەویت ، یاخود جگە لە ئەویت ، ئەگەر چاوی دڵت کرایەوە و گەشتیتە خوداناسن ، دەزانیت کەوا خودات ناسیوە بە خۆی نەوەک بە خۆت ، بۆنمونە : تۆ نازانیت کە ناوت مەحمودە ، ناسـراویشـیت بە مەحمود ، ناو و ناسـینەکەشـت لە ڕاسـتیدا یەکێکن ،

لەوانەیە پێت وابێت ناوت موحەمەدە دواتر بزانیت کە تۆ مەحمودیت ، لێرەدا هەبوونت بە بڕیاردانە ، ناوی مەحمود و ناسین بە موحەمەد لەسەرت لاچوو بەوەی کە خودی خۆت زانیت کە تۆ مەحمودیت ، نەبویت بە مەحمود هەتا ناوی موحەمەدت لانەبرد ، ئەوەش خودی هەبوونتە ، چونکە لەناوچوون و نەمان دوای جێگیرکردنی هەبوونە ، و جێگیرکردنی هەبوونت لەگەڵ هەبوونی خودا هاوەڵ و هاوبەشدانانە بۆ خودا ، بەم نمونەیە هیچ لە مەحمود کەم نەبووەوە و نەش موحەمەد لەناوچوو و فەنابوو لە مەحمود ، نەش مەحمود چووە ناو محەمەد ، نەش لێوەی دەرچوو ، دوای ئەوەی مەحمود خۆی ناسی کە مەحمودە نەوەک موحەمەد ، ئەوا خۆی بە خۆی ناسیوە نەوەک بە موحەمەد ، چونکە موحەمەد بوونی نەبووە لە بنەڕەتدا ، بەڵکو مەحمود بنەڕەت و بنچینەکەیە ، (خودا بوونی هەبوو و هیچ شتێکی لەگەڵ نەبوو ئێستاش هەر بەو شێوەیەیە) ، کەواتە ناسەر و ناسراو یەکێکن ، گەیشتوو و پێگەیشتراو یەکێکن ، بینەر و بینراو یەکێکن ، خۆشەویست و خۆشویستراو یەکێک ، ناسەر سیفەتێتی و ناسراو خودی خۆیەتی ، وەسفکەر و وەسفکراو خۆیەتی ، سیفەت و وەسفکراو یەکێکن ، ئەمەیە ڕوونکردنەوەی (ئەوەی خۆی بناسێت ئەوا خودا دەناسێت) ، هەرکەس ئەم نمونەیە تێ بگات ، دەزانێت کەوا نە گەیشتن هەیە و نە جیابوونەوە ، ئەوکات کەسی ناسەر دەزانێت کە خۆیەتی ناسراوەکە ، و بینەر هەر خۆی بینراوە ، گەیشتوو هەر خۆی پێگەیشتراوە ، کەسی تری پێ نەگەیشتووە و کەسی تریش لێوەی جودا نەبووە ، ئەوەی لەمە تێبگات ڕزگاری دەبێت لە هاوەڵ و هاوبەش دانان بۆ خودا ، ئەگەرنا ڕزگاری نابێت لە هاوبەش و هاوەڵدانان ، زۆربەی خوداناسان کە وا دەزانن خۆیان ناسیوە و بەمەش خودایان ناسیوە ، ئەوەیە کە ئەوان هەبوونیان نەماوە ، و وتوویانە کە ڕێگاکە ئاسان نابێتەوە بەبێ فەنابوون یاخود فەنا لە فەنابووندا ، ئەمەش بەهۆی تێنەگەیشتنیان لە فەرمایشتی پەیامهێن (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) ، ئەوەش بەهۆی گومانبردنیان کە بەمە هاوبەش و هاوەڵدانان دەسڕنەوە ساتێک لەبەر نەهێشتنی هەبوونیان ، واتا فەنابوونی هەبوونیان ، ساتێکیش لەبەر

**فەنابوونیان لە فەنادا ، ســاتێکیش بۆ نەمان و ســاتێکیش بۆ ونبوون ، ئەمانەش هەمووی ئاماژەن بۆ هاوەڵ و هاوبەشــدانان ، چونکە ئەوەی پێی وابێت شــتێکە جگە لە خودا ، و لەناوبچێت بە هەبوونی خودا ، ئەوا جێگیری کردووە کەوا شـتێک هەبووە جگە لە خودا ، ئەوەشــی جێگیری بکات کە جگە لە خودا شــتێکی تر هەیە ، ئەوا هاوەڵی داناوە بۆ خودای گەورە ، خودا ئەوان و ئێمەش ڕێنوێنی بکا بۆ ڕێگای دروست بە ڕەحم و بەزەیی خۆی ، پشت و پەنایەکمان نییە جگە لە خودای گەورە و مەزن**

**دەڵێم :**

**ظننت ظنونا بأنك أنت          وما أن تكون ولا قط كنت**

**فإن أنت أنت فإنك رب          وثاني اثنين دع ما ظننت**

**وات دەزانی تۆ خۆتیت ، نە دەبیت و نەش بویت ، ئەگەر تۆ خۆت بیت ئەوا تۆ خودایت ، ناشــکرێ دوو خودا هەبێ ئەمە لە مێشکت لا بدە**

**فلا فرق بين وجوديكما          فما بان عنك و لا عنه بنت**

**فإن فلت جهلا بأنك غير          خشنت و إن زال جهلك لنت**

**جیاوازی لە نێوان بونی تۆ و ئەو نییە ، نە ئەو لە تۆ لاچووە و نەش تۆ لە ئەو ، خۆ ئەگەر بە نەزانی بڵێیت کە جگە لە ئەویت ، هەڵەت کرد ، ئەگەر نەزانیەکەت لەسەر لابچوایە پاشگەز دەبویتەوە**

**فوصلك هجر و هجرك وصل     وبعدك قرب بهذا حسنت**

**دع العقل وافهم بنور انكشاف     لئلا يفوتك ما عنه صنت**

**ولا تشرك مع الله شيئا          لئلا تهون و بالشرك هنت**

**گەیشـتنت پێی کۆچکردنتە و کۆچکردنت گەیشـتنتە پێی ، دووریشـت لەو نزیکیتە بەمە تێبگە ، واز لە عەقڵ بێنە و بە ڕووناکی کەشـف تێبگە بۆ ئەوەی هیچت بەسـەر تێنەپەڕێت ، لەگەڵ خودا هیچ شـتێک مەکە بە هاوبەش و هاوەڵ ، بۆ ئەوەی نەکەویتە هەڵە و بە هاوەڵدانان ڕێگا ون نەکەیت**

**ئەگەر یەکێک بڵێت : تۆ ئاماژە بەوە دەکەیت کەوا ناسـینی خۆت بریتیە لە ناسـینی خودا ، و ناسـەر خودی خۆی جگە لە خودایە ، جگە لە خوداش چۆن خودا دەناسێت ؟ ئەوەشی خودا نەناسێت چۆن پێی دەگات ؟ لە وەڵامدا دەڵێم : هەرکەس خۆی بناسـێت دەزانێت کە هەبوونی بوون نییە ، نەبوونیش نییە ، بەڵکو هەبوونی ئەو بوونی خودایە بەبێ تێکەڵبونی بوونی بە بونی خودا ، و بەبێ ئەوەی بوونی بچێتە ناو بوونی خوداوە ، و بەبێ ئەوەی بوونی دەربچێت لە بوونی خودا ، و بەبێ هەبوونی لەگەڵیدا یاخود لەناویدا ، و بوونی خۆی بێ شـک بەوە دەبینێت کە هەبووە پێش ئەوەی هەبێت بەبێ لەناوچوونی هەبوونی ، و بەبێ لەناوچوون بە فەنا ، لەبەر ئەوەی لەناوچوونی شـتێک پێویسـتی بە جێگربوون و هەبوونی هەیە سەرەتا ، هەبوونی شتێکیش بە خۆی پێویست دەکات کە خۆی دروست کردبێت و پێشتر هەبوبێت ، نەوەک بە دەسەڵات و توانای خودا ، ئەمەش مەحاڵە و زۆر ڕوونە کە نابێت ، دەرکەوت کە ئەوەی باسمان لێوەکرد ئەوەیە کە ئەوەی خۆی دەناسێت ئەوە واتا خودا لەڕێی خودی خۆیەوە دەناسێت ، چونکە خودی خۆی تەنها ئەو(خودا) یە ، پەیامهێنەریش (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) هەر مەبەسـتی لە هەمان هەبوون بووە ، ئەوەی بەم پێگە و پلەیە بگات نە لە ڕووکەش و نە لە پەنهاندا بوونی خۆی نابینێت ، بەڵکو تەنها بوونی خودا ، قسە و وتەی خۆیشی بە فەرمایشتی خودا دەزانێت ، کردەوەکانیشـی بە کردەوەی خودا ، و بانگەوازکردنی بۆ ئەوەی کە خودا دەناسـێت ، لە ڕاسـتیدا بانگەوازە بۆ ناسینی خودی خۆی ، و بانگەوازکردنی بۆ ناسینی خودی خۆشی ، لە ڕاستیدا بانگەوازە بۆ ناسـینی خودا ، بەڵام تۆ نە بانگەوازت لەو بیسـتووە ، نە کردەوە لەوەوە ، بوونی ئەو بە جگە لە بوونی خودا دەبینیت ، وەک چۆن خۆشـت بە جگە لە خودا دەبینیت ، بەهۆی نەزانین و خۆنەناسـینت ،**

**ئیماندار ئاوێنەی ئیمانداره ، ئەو هەر ئەوە ، واتا لە تێڕوانینی یەکتر یەکێکن ، چاوی چاوی خودایە و تێڕوانینی تێڕوانینی خودایە بەبێ چۆنیەتی ، نە ئەو ئەوە بە چاوت و نە بە زانست و تێگەیشتن و وەهم و گومان و بینینت ، بەڵکو ئەو خۆیەتی بە چاو و زانست و تێڕوانینی خۆی**

**ئەگەر کەسـێک وتی : من خودام ، گوێی لێبگرە نەوەک لە کەسـی تر ، چونکە خودای گەورە خۆی بە خۆی دەفەرموێت : (من خودام هیچ خودایەک جگە لە من نییە {طه-١٤}) ، بەڵام تۆ پێی گەیشـتویت ، ئەگەر بگەیت بەوەی ئەو پێی گەیشـتووە ، تێدەگەیت چی دەڵێت ، و ئەوە دەڵێیت کە ئەو دەیڵێت ، ئەوە دەبینیت کە ئەو دەیبینێت ، کەواتە : هەبوونی شتەکان بوونی خودایە بەبێ بوونی ئەوان ، بۆیە مەکەوە گوومانەوە ، وەها وێنایی مەکە کەوا بونەوەران خودا بن ! ، هەندێک لە خوداناسـان فەرموویانە : (سـۆفی بونەوەر نییە – دروسـتکراو نییە) ، ئەوەش دوای ئەوەی درکێکی تەواویان کرد و گومانیان ڕەویەوە ، ئەم پارووەش بۆ ئەوانەیە کە گەروویان لە هەردوو گەردوون فراوانترە ، ئەگەرنا هەرکەس گەرووی بە ئەندازەی هەردوو گەردوون بێت ئەوا هاوڕا نابێت ، لەبەر ئەوەی لە هەردوو گەردوون گەورەترن ، کەواتە : بزانە کەوا بینەر و بینراو ، بەدیهێنەر و بەدیهێنراو ، ناسـەر و ناسـراو ، دروستکەر و دروستکراو ، درک پێکەر و درک پێکراو یەکێکن کە هەبوونی خۆی بە هەبوونی دەبینێت ، و درکی هەبوونی بە بوونی ئەو دەکـات ، بەبێ چۆنیەتی درک پێکردن و بینین و زانین ، بەبێ هەبوونی پیتەکانی وێنایی درک پێکردن و بینین و زانین ، وەک چۆن هەبوونی بێ چۆنیەتیە و ناسـینی بەبێ چۆنیەتیە و درک پێکردنی بێ چۆنیەتیە و بینینی خودی خۆی بێ چۆنیەتیە.**

**ئەگەر یەکێک بپرسـێت و بڵێت : بە چ تێڕوانینێک بڕوانینە شـتە جوان و شـتە پیسـەکان ، ئایا ئەگەر (ڕیقنە) یاخود (پشـقڵ)ێکمان بینی بڵێین ئەمە خوایە !!؟ لە وەڵامدا دەڵێم : پەنا و گەورەیی بەخودا کە شتێک لەم شتانە بێت ، قسەی ئێمە لەگەڵ کەسانێکە کە ڕیقنە بە ڕیقنە نابینن و پشقڵ بە پشقڵ نابینن ، ئێمە لەگەڵ کەسـانێکمانە کە چاوی دڵیان کراوەیە ، نەک هەمووی ، چونکە هەرکەس خۆی نەناسـێت**

،ئەوا نابیست و نابینایە ، و هەستا بیستن و بینینی بۆ نەگەڕێتەوە ، ناگات بە ئەو مانایانەی مەبەستمانە ، ئەو گفتوگۆیەش لەگەڵ خودایە نەک لەگەڵ جگە لەو یاخود لەگەڵ نابیستێک ، ئەوەی بگاتە ئەم پلە و پێگەیە دەزانێت کە جگە لە خودا نییە ، قســەی ئێمە لەگەڵ ئەوانەیە کە تێدەکۆشــن لە پێناو داواکردنی خودا ناسین ، و داواکردنی خود بۆ ناسینی خودا ، بەناو دڵیاندا وێنەی داواکارێک دەبینیت کە تامەزرۆیە بۆ خودا بەبێ هیچ نیاز و مەبەستێک.

ئەگەر کەسێک بپرسێت و بڵێت : خودا چاوەکان نایبینن بەڵام تۆ پێچەوانەی ئەمە دەڵێیت ، ئایا مەبەستی قسەکەت چییە ؟

لە وەڵامدا دەڵێم : هەموو ئەوەی وتمان مانایە بۆ فەرمایشــتی خودا : (چاوەکان درکی پێ ناکەن و ئەو درک بە چاوەکان دەکات {الانعام-١٠٣}) ، واتا هیچ کەســێک ، و هیچ چاوێکی لەگەڵ نییە کە درکی پێ بکات ، ئەگەر لە بووندا جگە لە خۆی هەبێت ، ئەوا دەبوو درکی پێ بکردایە ، خودا هۆشیاری کردووین و فەرموویەتی (چاوەکان درکی پێ ناکەن) ، ئەمەش چونکە جگە لە خۆی کەســی تر بوونی نییە ، واتا : کەس جگە لە خۆی درکی پێ ناکات ، بەڵکو خۆی دک بە خۆی دەکات و خۆی خودایە و کەس جگە ئەو بوونی نییە ، ئەو درک پێکەرە بۆ خودی خۆی بە خودی خۆی نەک کەســی تر ، چاوەکان درکی پێ ناکەن ، چونکە بینینێک نییە جگە لە هەبوونی ئەو

هەرکەس بڵێ : بە چاو درکی پێناکرێت چونکە چاو بەدیهێنراوە و بەدیهێنراویش درک بە شــتێکی کۆنی بێســەرەتا ناکات ، ئەوا ئەم کەســە خودی خۆی نانســێت چونکە هیچ شــتێک و تەنانەت چاوەکانیش بوونیان نیە جگە لە ئەو نەبێت ، ئەو درک بە هەبوونی خۆی دەکات بەبێ هەبوونی درک پێکردن ، و بەبێ چۆنیەتی بۆ جگە لە خۆی ، هەر بۆیە وتم:

عرفت الرب بالرب     بلا شك و لا ريب

فذاتي ذاته حقا        بلا نقص و لا عيب

خودام به خودا ناسی بەبێ شک و گومان ، خودی من خودی ئەوه ، بەبی کەم و بەبێ کەموکوڕی

ولا غيران بينهما     فنفسي مظهر الغيب

ومن عرفته نفسي     بلا مزج و لا شوب

دووانی جودا لەنێوانیان نییه ، خودی من دەرخەری پەنهانه ، و ئەوەی ناسیم هەر خودی خۆم بوو بەبێ تێکەڵ بوون و جودا بوون

وصلت وصول محبوب    بلا بعد و لا قرب

ونلت عطاء ذي قدم    بلا من ولا سبب

گەیشتم به حەزرەتی یار ، بەبێ دووری و بەبێ نزیکی ، بەبێ هۆ و بەبێ منەتکردن زۆری پێ بەخشیم

ولا فنيت له نفسي    ولا تبقى لذي ذوب

ولكن قد تعرت منك    عن عبد و عن رب

نه خودی خۆم بۆ ئەو لەناوبرد که جودا ببمەوه ، نەش تێکەڵ بووم لەگەڵی و تێیدا بتوێمەوه ، بەڵام ئەوەی جودای کردینەوه ئەوەبوو ، که تۆ خودایت و منیش بەنده

ئەگەر کەسێک بپرسێت و بڵێت: تۆ بوونی خودا دەسەلمێنیت و هەموو شتێک نەفی دەکەیت ، ئەی ئەم شتانه چییه که دەیبینین ؟

له وه‌ڵامدا ده‌ڵێم : ئه‌م پله و پێگانه له‌گه‌ڵ ئه‌و كه‌سانه‌ن كه جگه له خودا هیچ نابینن ، هه‌ركه‌س شتێک جگه له خودا ببینێ ئه‌وا وه‌ڵام و پرسیارمان له‌گه‌ڵی نییه ، چونكه ئه‌و ته‌نها ئه‌وه ده‌بینێ كه ده‌یبینێت ، هه‌ركه‌س خۆی بناسێت ، جگه له خودا هیچ نابینێت ، هه‌ركه‌سیش نه‌یناسی ئه‌وا خودا نابینێت ، هه‌موو جامێک به‌وه پڕ ده‌بێت كه تێی ده‌كرێت ، زۆر ڕوونكردنه‌وه‌مان له‌سه‌ر ئه‌م جۆره قسانه داوه پێشتر ، ئه‌وه‌ی نه‌بینێت ، نه ده‌بینێت و نه تێده‌گات و نه‌ش درک ده‌كات ، هه‌ركه‌سیش ببینێت ، ئه‌وا ده‌بینێت و تیده‌گات و دركی پێده‌كات ، ئه‌وه‌ی گه‌شتبێت ئاماژه‌یه‌ک بۆی به‌سه ، ئه‌وه‌شی نه‌گه‌یشتبێت نه به ئاماژه تێده‌گات و نه به فێربوون ، نه‌ش به وردبوونه‌وه و پێزانین و ده‌سته‌واژه و عه‌قڵ و زانست كه به‌ده‌ستی بهێنێت ، مه‌گه‌ر له‌حاڵه‌تێكدا كه له‌خزمه‌ت شـێخێكی كامڵی پێگه‌یشـتوو بێت ، مامۆسـتایه‌كی چاک و لێهاتوو و به‌توانا تا بیخاته سه‌ر ڕێگای ڕووناكی ، و ئه‌میش شوێنی بكه‌وێت و بیگه‌یه‌نێته مه‌به‌سته‌كه پشـت به‌خوا ، خوداش ڕێنوێنی ئه‌وانه ده‌كات كه ده‌یه‌وێت بۆ ڕێگا ڕاسـته‌كه‌ی ، خودا ئێمه و ئێوه‌ش سه‌ربه‌رز و سه‌رفراز بكات بۆ ئه‌وه‌ی خۆی پێی خۆشه و ده‌یه‌وێت ، به‌سه‌ر هه‌موو شتێک ده‌سه‌ڵاتدار و به‌توانایه ، وصلى الله على سيدنا محمد و آله و صحبه وسلم .

